بسم الله الرحمن الرحيم

## ناسنامەی کتێب

ناوی پەرتووک: ژیان لەگەڵ خودا

نووسینی: ژولیا شەوکەت

نەخشەسازیی ناوەوە: عبداللە خاکی

نەخشەسازیی بەرگ: عوسمان محمد

نۆرە و ساڵی چاپ: یەکەم، ١٤٤٥ کۆچی ٢٠٢٣ میلادی

# پێشکەشە

- بە دایک و باوکی ئەزیز و خۆشەویستم کە خوای گەورە هەردووکیانی کردووە بە ڕوناکی ژینم .
- بە سەرجەم ئەو دایک و باوکەی کە لە خەمی دونیاو قیامەتی کەچەکەیدایە.
- بە سەرجەم ئەوکچانەی کە لەفەرمانی خودا دەرناچن .
- بەو دایک و خوشکانەی کە لەم سەردەمی نەمان و شەرم و ڕێزەدا بوون بە نموونەی ئافرەتانی خاوەن ڕێز و شەرم و خاوەن تەقوا و پۆشاکی شەم و ڕێزیان پۆشیوە
- پێشکەشە بەو خوشکانەی کە پۆشاکێکیان هەڵبژاردووە کە خوای گەورە بۆی هەڵبژاردوون .
- بە سەرجەم ئەو خوشکانەی کە ڕێگای دایکە عائیشەو خاتوو مەریەمی ڕێزداریان گرتووە.

# پێشەکی نووسەر

سوپاس و ستایشی بێ پایان بۆ پەروەردگاری هەموو جیهان، خاوەن سۆز و بەزەیی بۆ بەندەکانی، کانگای ڕەحمەت و بەرەکەت بۆ دڵ و ڕۆحی خۆشەویستانی، درووود و سڵاوی بێ هاوتا برژێت بەسەر پەیامبەر و نووری چاوانمان موحەممەد پێغەمبەری خوا (ﷺ)..

ئازیزان و خۆشەیستانم خوشکانی نازدار و قەدر گرانم، سڵاو و ڕەحمەتی پەروەردگارتان لێ بێت، داواکارم لە خوای گەورە لە هەموو هەڵە و کەموکورتییەکمان ببورێت..

ئەم نامیلکەیەی لە بەردەست بەرێزتە تایبەتە بە خانمانی ئازیز، باس لە چەند پێگە و برگەیەك دەکات کە گرنگترینیان بریتییە لە گرنگی حیجاب و باڵاپۆشی بۆ ئافرەتان، پاشان گەورەیی ئافرەت لە ئایینی پیرۆزی ئیسلامدا، هەروەها ئایا حیجاب و باڵاپۆشی ڕاست و دروست کامەیە؟ هەموو ئەمانە و چەند خاڵێکی تری گرنگ لەژێر ڕۆشنایی قورئان و فەرموودەی پێغەمبەری سەروەرماندا (ﷺ) ڕووندەکەینەوە و پێشکەش بە بەرێزتان دەکەم.



# حیجاب

**حیجاب:** بریتییە لەو پۆشاکەی کە هەموو لاشەی ئافرەت داپۆشێت تەنها دەست و دەموچاو نەبێت، تا پیاوانی بێگانە بەرزی و نزمی لاشەیان نەبینن.



# گرنگی باڵاپۆشی

حیجاب و باڵاپۆشی کە هێما و ڕەمزی ئافرەتانی سەنگین و خاوەن ئاکاری جوانە.. هەر زۆر لە مێژە بووە بە مایەی ڕێز و شکۆ و خۆشەویستی و قەڵغانی پاراستنی ئافرەت لە تیری دوژمن و چاوبرسی و شەیتانەکان..

خوای گەورە بە هەزاران پێغەمبەریشی بۆ مرۆڤەکان ڕەوانە کردووە و، فەرمانی بە چاکە و ڕێگریکردن لە خراپە پێکردوون.. فەرمایشتی خوای گەورەیە کە دەبێت ئافرەتان داپۆشراوبن، تا دووربن لە هەموو بەڵایەکی ژیانی دنیا و سزای

دواڕۆژ، هەروەها تا شیرازە و ڕەوشتی کۆمەڵگە تێك نەچێت. هەر لەبەر ئەوە کاتێك سەیری مێژووی شار و وڵات و نیشتمانی خۆمان دەکەین، دەبینین ئافرەتانی پێشینی ئێمە لە ڕووی جلوبەرگ و ڕەوشت و تەندروستییەوە زۆر لە پێش بوون و نموونەی ئافرەتی مەرد و ڕەوشت بەرز بوون.. بەڵام کاتێك ئەو جلوبەرگ و باڵاپۆشییە نەما، چی دەبینین؟ چی تاوان زیادی کردووە؟

ژن کوشتن، لادانی جنسی، ئیمۆ، دزیی، خیانەتی زەوجی، ناپاکی، داوێن پیسی، خیانەتی هاوڕێیەتی، گەندەڵی، لەش فرۆشی... هتد، هۆکاری زیادبوونی

ئەم هەموو کارە خراپ و ناشیرینانە چییە؟ هۆکاری هەموو ئەم تاوانانە کەمبوونەوەی ڕەوشتە لەناو موسڵماناندا بەتایبەتی لەناو ئافرەتاندا.. کێش لە کۆمەڵگەدا خاوەن و هەڵگری ئاڵای ڕەوشت و ئاکاری بەرز و جوانە؟ لە ڕاستیدا ئافرەتانی باڵاپۆش هەڵگری ئەو ئەمانەتەن.. زۆر جوانیش وتراوە: هەر کات ئافرەت باڵاپۆش و خاوەن ڕەوشتی جوان بێت، ئیتر تاکەکانی کۆمەڵگە ترسیان لە کوڕەکانیان نابێت کاتێك لە ماڵ دەچنە دەرەوە، چونکە دەزانن ئافرەتانی خاوەن حیجاب بەهۆی ڕەوشتی جوانیانەوە لە

ئەمانی خوای گەورەدان، ئیتر ئەو کات کوڕە گەنجەکان شەرم دەکەن کە تانە و تەشەریان لێبدەن و، بە چاوی خراپ سەیریان بکەن، یان خوانەخواستە چاوچنۆکیی لە ناموسیان بکەن، چونکە بە خوشکی خۆیانیان دەزانن..

پاشان ئەگەر لە ڕووی داتاوە سەیری وڵاتانی خۆرئاوا بکەین، وەك: (فەڕەنسا، هۆڵەندا، بەلجیکا، ئەمریکا، بەریتانیا، ئیتاڵیا)، دەبینین ڕۆژ بە ڕۆژ باڵاپۆشی لەو وڵاتانەدا زیاد دەکات، تەنانەت پۆلیس و بەرپرسانی هەندێ لەو وڵاتانە ڕایانگەیاندووە کە ئەو گەڕەك و شوێنانەی کە

ماڵی موسڵمانانی لێیە باشترینی گەڕەکەکانن! چونکە کەسی سەرخۆش و دز و لەش فرۆشی تێدا نییە، بۆچی؟ چونکە ئافرەتەکانیان بوون بە سومبولی ئاشتی بەهۆی باڵاپۆشیی و ڕەوشتی بەرزیان.

هەروەها دەبێ ئەوە بزاین کە ئەگەر ئافرەت خاوەن پێگە و مەقامی گەورە و گرنگی خۆی لای خوای گەورە نەبووایە، ئەوا هەرگیز خوای گەورە فەرمانی نەدەکرد کە خۆیان داپۆشن و خۆیان لە چاوبرسی و دڵ نەخۆشەکانی سەردەم بپارێزن، چونکە کاتێك ئافرەت خاوەن ئایین و ڕەوشتی

جوان بێت، لەژێر دەستیدا نەوەیەکی بە ڕەوشت و پەروەردەکراو دروست دەبێ، بەڵام کاتێك خاوەنی ئایین و ڕەوشت نەبوو، دەبێتە فیتنە و بەڵا بۆ حاڵ و ماڵ و ژینگەکەی.

کەواتە ئەی خوشکی ئازیزم ببە بە کلیلێك بۆ کردنەوەی دەرگای خێر و بەرەکەت و داخستنی دەرگای تاوان و خراپەکان..

ببە بە نموونە و ڕەمزی ئاشتی بۆ خۆت و دۆستانت.. تا ببیتە خۆشەویستی خوا و لە ڕیزی ئافرەتە پاکیزەکان و، ئەهلی بەهەشتدا ناوت تۆمار بکرێت.

چەند خۆشە وەك خاتوو مەریەم (سەلامی خوای لێبێت) هەموو پیاوان ڕێزت لێ بگرن و، نزای خێرت بۆ بکەن.

چەند گەورەییە وەك دایکە ئائیشە (خوای لێ ڕازی بێت)، پیاو و ژن شەرمت لێ بکەن.

چەند شکۆمەندییە بۆ تۆ، کە بە باڵاپۆشییەکەت ڕێز و گەورەیی خێزانەکەت دەپارێزیت.

لەبەرئەوە خوشکی ئازیزم ئەگەر دەتەوێ تامی ئیمان بکەیت؟ ئەگەر دەتەوێ چێژ لە ژیان ببینی؟ ئەگەر دەتەوێ دوعا و نزاکانت گیرابێت؟ ئەگەر دەتەوێ خۆشەویستی خوا و دۆستانت

بیت؟ ئەوە باڵاپۆشی هەڵبژێرە و بیکە بە باڵای ژیانت، دڵنیابە مژدەی خۆشی و سەرکەوتن لە ناخ و دڵتا وەك کانیاوی بەهار دەتەقێت و دەبیتە هێما و ڕەمزی خۆشبەختی لە دنیا و دوا ڕۆژدا.

کەواتە خوشکی نازدارم بزانە حیجاب و باڵاپۆشییەکەت دەبێتە هۆی (پاکبوونەوەی دڵ و دەروونت لە گوناهە، دوورکەوتنەوە لە بیرکردنەوەی خراپ و دوورکەوتنەوە لە خەمۆکی) هەروەها نیشانەیە بۆ (دامەزراوی ئیمانت، پاکیزەی و حەیا و شەرمت، گوێڕایەڵی خوا و پێغەمبەر (ﷺ).

هەروەها ئەوە بزانە کە حیجاب خواپەرستییە نەك نەریت و عادەت، وەك ئەوە وایە کە بەردەوام یادی خوا و کاری سوننەت بکەیت.



# گەورەیی ئافرەت لە ئیسلامدا

بەڕێزان لە کاتێکدا باس لە گەورەیی ئافرەت لە ئیسلامدا دەکەین، ئەم گەورەیی و ڕێز و پلە و مەقامە فلان زانا و عاریف و بیرمەند و مامۆستا بۆیان بڕیار نەداوە، بەڵکو خوای گەورە لەسەروو حەوت تەبەقەی ئاسمانەوە ڕێز و قەدری ئافرەتی هێندە بەرزکردووە کە لە هەموو فریشتەکان بەڕێزتر و گەورەترن، خوای گەورە بە (جوبرەئیل)ی فەرمووە (سەلامی خوای لێ بێت): ئەی جوبرەئیل بڕۆ ئەم پەیامەی من بە

موحەممەد (ﷺ) بگەیەنە و پێی بڵێ: کە ئافرەت لە شەریعەتی ئیسلامدا ئەوەندە گەورە و بەڕێزە، کەس بۆی نییە بێ ڕێزی بەرامبەر بکات یان بیان شکێنن.

بەڵێ پاش ئەوەی ڕێز و قەدری ئافرەت لە ئیسلامدا جێگیر کرا، ئیتر کۆتایی هات بە زیندە بەچاڵکردنی کچان لە ناو عەرەبدا و، فڕێدانیان لەناو بیر و خۆڵکردن بەسەریاندا و فڕێدانیان لەناو بیابانی وشکی لمیندا، بەڵام مەخابن ئەوانەی بەناوی مافی ئافرەتەوە قسان دەکەن، نەك یاسایان پێ نییە بۆ خزمەتی ئافرەتان، بەڵکو

ژیانیان زیاتر دەخەنە مەترسییەوە لە کاتی کێشەکاندا، لەبەر ئەوە پێویستە ئەوانیش بگەڕێنەوە بۆ یاسای ئاسمانی نەك یاسای دروستکراوی زەمینی.

عائیشە (خوای لێ ڕازی بێت) خێزانی پێغەمبەری خوا بوو (ﷺ)، کاتێك پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە سەفەرێك یان ئیشێکی نارەحەت دەگەڕایەوە، بە ئائیشەی دەفەرموو: "ئائیشە وەرە لە نزیکم دابنیشە، با چاوم لێت بێت و پشوو بدەم".

یاخود کاتێك پۆشاکە موبارەکەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەدڕا خۆی دەچوو بە دەرز و بەن دەیدوریيەوە، بە ئائیشەی دەفەرموو تۆ ئیشوکاری ماڵەوەت زۆرە، دەبێ منیش هاوکارت بم.

تەنانەت لە کاتی نانخواردندا سەرورمان (ﷺ) دەچوو بەو جامە ئاوی دەخواردەوە کە ئائیشە ئاوی پێ دەخواردەوە، لێوی دەنا بەو قەراغەی جامەکەوە کە ئائیشە لێوی پێوە نابوو.



## ڕێز و قەدری ئافرەت لە قورئانی پیرۆزدا

ئەگەر بە وردی لە قورئانی پیرۆز ڕابمێنین و سەیری سوورەت و ئایەتەکان بکەین، ئەو ڕاستییەمان بۆ ڕۆشن دەبێتەوە کە چۆن خوای گەورە ڕێز و قەدری ئافرەتی لە ئیسلامدا بەرزکردۆتەوە:

١. قورئانی پیرۆز لە ١١٤ سوورەت پێکهاتووە، یەکێك لە سوورەتەکان ناوی سوورەتی (النساء)ە، واتە: ئافرەتان کە (١٧٦) ئایەتە. بەڵام یەك سوورەت نییە بە ناوی سوورەتی (الرجال) واتە سوورەتی پیاوان.

٢. سوورەتێکی دیکەمان هەیە بەناوی سوورەتی (مریم) کە (٩٨) ئایەتە، لە کاتێکدا خاتوو مەریەم تەنها کچێکی خواناس و ساڵح بووە، خوای گەورە لە هاوتای خواناس و ساڵحێکی دیکەدا ناوی هێناوە کە (لوقمانی حەکیم)ە، لەبەرئەوە ناوی سوورەتەکەی ئەویش سوورەتی (لقمان)ە کە (٣٤) ئایەتە.

٣. وشەی ئافرەت لە قورئانی پیرۆزدا (٨٥) جار هاتووە، بەڵام وشەی پیاو (٢٤) جار هاتووە.



# ڕێز و قەدری ئافرەت لە سوننەتدا

پاشان لە زۆرێك لە فەرموودەكانی پێغەمبەرماندا (ﷺ) ئەو ڕێز و تەقدیرە دەبینرێت:

١- خۆشەیست (ﷺ) لە فەرموودەی پیرۆزی خۆیدا ئافرەتانی بە (القوارير) ناو هێناوە، واتە شووشە، مەبەستی ئەوە بووە ڕێز لە ئافرەت بگرن بە تایبەت خێزان و كچەكانتان با نەشكێن، ئەم جۆرە ڕێزە ڕێزگرتنە لە هەست و نەستی ئافرەت بە گشتی.

٢- پاشان نووری چاومان (ﷺ) لە وتاری ماڵئاوایدا هەموو هاوەڵانی کۆکردەوە و بە دەنگی بەرز پێی فەرموون: ئافرەتان ڕاسپاردە و ئامانەتی پەروەردگارن بۆ ئێوە، ڕێزیان بگرن و چاك ئاگاداریان بن، ئەمە لە کاتێکدا بوو کە هاوەڵان چاك دەیانزانی واتای ڕاسپاردە چییە، لەبەر ئەوە بە ڕۆح و بەدڵ خزمەتی ماڵ و خێزانەکانیان دەکرد و ڕێزیان لێ دەگرت.

٣- هەروەها پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە فەرموودەکانیدا وشەی (خیرا، صالحة) بەکار دەهێنێ بۆ ئافرەتان. بۆچی؟؟ چونکە ئافرەتی باش

و خاوەن ئایین دەبێتە خێر و بەرەکەت بۆ هاوسەر و ماڵ و ژینگەکەی.

٤- لە ئەحکام و مافەکانیشدا، لە سوننەتدا هاتووە کە ئافرەت دەتوانێت خاوەن ماڵ و موڵك و زەوی و خانوو و میراتی و مارەیی خۆی بێت، کەس بۆی نییە لێی زەوت بکات مەگەر بە حەقێکی شەرعی نەبێت.



# حیجاب و باڵاپۆشی تەواو کامەیە؟

١- دەبێت ئەو حیجابەی کە دەیپۆشیت تەنها لەبەر خوای گەورە بێت، تەنها فەرمانی خوای گەورە جێبەجێ بکەیت و خۆت لە تاوان بپارێزیت، نەکەی حیجاب بەکارهێنی بۆ خۆ دەرخستن.

٢- حیجاب نابێت تەسك یان تەنك بێت و لاشەت دەربکەوێت، دەبێت فراوانییەکەی هەموو لاشەت بگرێتەوە.

٣- نابێت پۆشاکی ئافرەت لە پۆشاکی پیاوان بچێت، دەبێت جیاوازبن.

٤- نابێت حیجاب ڕازاوە بێت، چونکە سەرنجڕاکێش دەبێت و ڕێگەپێدراو نابێت.

٥- بۆ ئافرەت بەکارهێنانی بۆنی تیژ و سەرنجڕاکێش لە کاتی چوونە دەرەوەدا دروست نییە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَاجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَاءِ الْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَابِيبِهِنَّ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰ أَن يُعْرَفْنَ فَلَا يُؤْذَيْنَ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾[١]

---

١ -(الاحزاب: ٥٩).

واتە: "ئەی پێغەمبەر (ﷺ) بە هاوسەرانت و کچەکانت و هەموو ئافرەتانی ئیماندار بڵێ: بە پۆشاکی باڵاپۆشی خۆیان داپۆشن، چونکە ئەوە باشترین شتە پێی بناسرێنەوە، تا ئازار نەدرێن و تووشی گیروگرفتی دنیا نەبن، هەمیشە و بەردەوام خوای گەورە لێخۆشبوو و میهرەبانە لە کەموکورتی ڕابردووتان خۆش دەبێت".

کەوابوو خوشکی ئازیزم ئاگاداربە (سەرپۆش و حیجاب)، دوو ئایەتی قورئانی پیرۆزن، ئێوەی بەڕێز بە کرداریی و بە باڵاپۆشیەکەتان ڕاڤەیان دەکەن.

# چۆن بتوانم لەسەر باڵاپۆشیی بەردەوام بم؟

١- دەبێت گرنگی زۆر بە لایەنی ئیمانی و ڕۆحیی خۆت بدەیت، بە تایبەت کردنی نوێژی سوننەت لەگەڵ نوێژە فەرزەکاندا.

٢- لەو کەسانە نزیك مەبەرەوە، کە دەبنە هۆی ئەوەی لە خوا دوورت بخەنەوە.

٣- هەوڵبدە خواپەرستی نهێنیت هەبێت لەنێوان خۆت و خوادا.

٤- وانەی قورئان و فەرموودەت هەبێت لای مامۆستای شارەزا، تا زیاتر لە ئایین نزیك بیتەوە و ئیمانت بەهێز و بەرزتر بێت.

٥- خوێندنی وانەی (فیقهی) لە خزمەت مامۆستای شارەزا، تا حوکمە شەرعییەکانی تایبەت بە ئافرەتان بزانیت و خواپەرستییەکی تەواو و پاك بۆ خوا بکەیت.

وصلى اللّٰه وسلم على سيدنا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين.

٤/٤/١٤٤٤ك

٢٩/١٠/٢٠٢٢ز

شەممە- سلێمانی

**داوام وایە لە تۆی خوێنەر لە دوای خوێندنەوەی تۆش ببیت بە یارمەتیدەری خوشکێکی موسوڵمان تا وەک و هەموو خوشکانمان بێبەش نەبن لە پۆشینی پۆشاکی شەرم و ڕێز و حەیا.**